# ڕێگای چوون بەرەو بەهەشت



ئامادەکردنی : محمد بن صالح المنجد
وەرگێڕانی : کەمال حسەن زەنگەنە

ڕێگای چوون بەرەو بەهەشت

# ڕێگای چوون بەرە و بەهەشت

نوسینگەی فریشتە



ئامادە کردنی: شێخ محمد بن صالح المنجد

وەرگێڕانی : کەمال حەسەن زەنگەنە

بسم الله الرحمن الرحيم

پێناسی کتێب

ناوی ناميلـــکە : رێگای چوون بەرەو بەهەشت

ئـامــادەکردنی : شێخ محمد بن صالح المنجد

وەرگێرانـــــی : کەمال حەسەن زەنگەنە

دیـــــزاین : عزالدين عبدالله

دارشتنی بەرگ : حاجی هیوا

نۆرەی چـــاپ : چاپی دووهەم ٢٠١٠

٤٦٥٨١٥٤

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٨٩١ ) ساڵی (٢٠٠٩) دراوەتێ

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على محمدوعلى آله وصحبه ومن سار على سنته الى يوم الدين..

کاتێك سەردانی یەکێك لەماڵەکانی خوای پەروەردگارم کرد لەسەردیواری مزگەوتەکە بڵاوکراوەیەکی بەنرخ و پرمانام بینی ، پاش ئەوەی بەوردی خوێندمەوە بینیم زۆرکورت و سوودبەخشە، بۆیە بڕیارمدا وەری بگێڕمە سەرزمانی شیرینی کوردی بۆئەوەی مووسڵمانان سوودی لێوەربگرن و لەژیانی ڕۆژانەیاندا ڕەنگ بداتەوە وخۆیانی پێ جوان و ڕازاوە بکەن، بڵاوکراوەکەش لە ئامادەکردنی زانای ناودارشێخ (محمد بن صالح منجد)ە، کەبەشێوەی پرسیارو وەڵام هێناویەتی و، خۆی پرسیارەکەی کردووەو بەفەرمایشتی پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾وەڵامی داوەتەوە.بۆیە تابڵێی شێوازێکی ڕێك و پێکەو هەموکەسێك دەتوانێ تێی بگات و سودی لێ وەربگرێت، منیش پێم خۆشبو هەندێکی تری بۆزیادبکەم بۆئەوەی زیاترتێروتەسەل بێت ،هیوادارم ببێتە هۆی کەمکردنەوەی بیانوی موسڵمانان لەوەی

کەکـەم زانسـتن دەربـارەی کـردەوە چـاکەکان و، هانیشـیان بـدا بۆپەلەکردن لەکردنی کاروکردوەچاکەکان.

ئـە وەشـی بـە لامـەوەگرنگ بولێکۆڵینەوەوبولەفەرمایشتەکان، بۆیـە هەسـتام بـە تەماشـاکردنی هەنـدێك لەپـەرتوکی فەرمایشـتەکان، بەتایبـەتیش پـەرتوکی (صحیح الجامع الصغیر)ی شـێخ ئـە لبـانی ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت، ئەمـەش بـۆلابردن وڕەوەوانـدنـەوەی هـەرگومانێك کەبەسـەردڵی خوێنـەردابێت ، داواکـارم خـوای گـەورە لێمی وەربگرێت و ئێوەش لە پاڕانەوەکانتان بێبە شمان مەکەن...

کەمال حەسەن زەنگەنە

٣٠/شە عبانی/١٤٣٠ك بەرامبەربە/٢١/٨/٢٠٠٩زاینی.....

# بسم الله الرحمن الرحيم

*پرسیار/ئایە دەتەوێ لە تاوانەکانت پاك ببیتەوە وەکو ئەو ڕۆژەی لەدایکبووی ..؟*

**وەڵام/پێغەمبەر﴿صلی الله علیه وسلم﴾ دەفەرمووێ: مَن أتى هذا البَيتَ فلَم يَرفُث ولَم يَفسُق رَجَعَ كَماوَلَدَتهُ أمُّهُ. (رواه البخاري)**

**واتە: هەرکە سێك سەردانی ئەم بەیتە (کە عبە) بکات و ڕەفتار و گوفتاری نابەجێ ئەنجام نەدات و گوناه و تاوان نەکات ، دەگەڕێتەوە وەکو ئەو دۆخەی تازە لە دایك بوبێت ..(رواه البخاری)**

*پرسیار/ئایە دەتەوێ لە هەموو تاوانەکانت پاك ببیتەوە ..؟*

**وەڵام/پێغەمبەر﴿صلی الله علیه وسلم﴾ دەفەرمووێ: من توَضّأ نَحوَ وُضوئي ثمَّ صَلى رَكعَتَينِ لايُحَدِّثُ فيهِما نَفسَهُ (وفي رواية) لايَسهو فيهِما غُفِرَ لهُ ماتَقَدَّمَ مِن ذَنبِهِ. (رواه البخاري)**

واتە: هەرکەسێك وەکو دەست نوێژی من دەست نوێژبگرێت و پاشان دوو رکات نوێژبکات و، دالّغە لیّ نەدات لەناو نوێژەکەدا، لە هەمووگوناهەکانی رابووردوی دەبوردرێت.

*پرسیار/ئایە چاکەت دەویّ بەژمارەی کەسەکان ..؟*

وەلاّم/ پێغەمبەر﴿صلی الله علیه وسلم﴾ دەفەرمووێ: مَنِ استَغفَرَ لِلمُؤمنِينَ وَلِلمُؤمِنَاتِ كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤمِنٍ وَمُؤمِنَةٍ حَسَنَةً.(رواه الطبراني وصححه الألباني)

واتە: هەرکەسێك داوای لێخۆشبوون بکات بۆ پیاوانی باوەردارو ئافرەتانی باوەردار، ئەوا خوای گەورە بەهەرپیاوێکی باوەردارو ئافرەتێکی باوەردارچاکەیەکی بۆدەنووسێت..

*پرسیار/ئایە چاکەت دەویّ وەکو کێوە گەورەکان..؟*

وەلاّم/ پێغەمبەر﴿صلی الله علیه وسلم﴾ دەفەرمووێ: مَنْ تَبِعَ جَنَازَةَ مُسلِمٍ إِيمَاناً وَاحتِسَاباً وَكَانَ مَعَهَا حَتَّى يُصَلَّى عَلَيهَا وَيُفرَغَ مِنْ دَفنِهَا فَإِنَّهُ يَرجِعُ مِنَ الأَجرِبِقِيرَاطَينِ كُلُّ قِيرَاطٍ

مِثلُ أحُدٍ، ومَنْ صلى عليها ثمَّ رَجعَ قبلَ أنْ تدفن فإنهُ يَرْجعُ بقيراطٍ مِنَ الأجْرِ.(رواه البخاري)

واته: هەرکەسێك شوێنی تەرمێکی باوەردار بکەوێ و باوەری هەبێ و بەتەمای پاداشت بێت، وە لەگەڵی بێت تاکونوێژی لەسەردەکرێ و بشاررێتەوە، ئەوا دەگەرێتەوە بەپاداشتی دوقیرات، هەر قیراتێك بەئەندازەی کێوی ئوحودە، وەهەرکەسێك نوێژی لەسەربکات و بگەرێتەوە پێش ئەوەی بشاررێتەوە ئەوە بە پاداشتی قیراتێك دەگەرێتەوە..(رواەالبخاری)

*پرسیار/ ئایە یەك چاکەت دەوێ..؟*

وەلأم/پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ: مَنْ هَمَّ بحَسَنَةٍ فلمْ يَعمَلْها كُتبتْ لهُ حَسَنةٌ.(متفق عليه)

واته: هەرکەسێك ویستی چاکەیەك بکات و بۆی نە گونجاو نەیکات ، خوای گەورە چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنوسێت.

*پرسیار/ ئایە دەچاكەت دەوێ..؟*

وەڵام /پێغەمبەری خوا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾دەفەرمووێ: مَنْ قرأ حَرْفاً مِنْ كِتابِ اللهِ فلهُ بِكُلِّ حَرْفٍ عَشْرُ حَسَناتٍ.(أخرجه البزارُ في مسنده)

واتە: هەركەسێك پیتێك لەفەرمایشتی خوای گەورە بخوێنێت، بەهەرپیتێك دەچاكەی بۆ دەنوسرێت.

*پرسیار/ ئایە پەنجاچاكەت دەوێ..؟*

وەڵام/ پێغەمبەری خوا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دەربارەی فەرزبونی نوێژ لەخوای گەورە دەگێرێتەوە كە فەرموویەتی:

لايُبَدَّلُ القَوْلُ لَدَيَّ هِيَ خَمْسٌ وَهِيَ خَمْسُونَ مِنَ الأجْرِ.

واتە: قسە و پەیمان لای من ناگوردرێ نوێژەكان پێنجن لەكردندا بەڵام لە پاداشتدا پەنجان (واتە یەك بە دە)

*پرسیار/ ئایە حەوت سەد چاكەت دەوێت..؟*

وەڵام/ خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿مثل الذين ينفقون أموالهم في سبيل الله كمثل حبة أنبتت سبع سنابل في كل سنبلة مائة حبة﴾ البقرە ٢٦١

واتـە : نموونـەی ئەوانـەی ماڵـەکانیان لـە پێنـاوی خـوای گـە ورەدا دەبەخشن وەکو تۆوێك وایە کە حەوت گوڵی تێـدابێت، لە هەرگوڵێکدا سەددانەی گرتبێ..

*پرسیار/ ئایە لەمەزیاترت دەوێ.؟*

وەڵام/ خوای گەورە دە فە رمـووێ ﴿والله يضـاعف لمـن يشـاء﴾

واتــە : خـوای گـەورە بـۆ هەرکەسـێك کەبیـەوێت پاداشـت چەند بەرامبەردەکات ...

*پرسیار/ ئایە جاکەی بێ ئەندازەت دەوێ..؟*

وەڵام/ خـوای گـەورە دەفـەرمووێ ﴿إنمـا يـوفى الصـابرون أجرهم بغيرحساب﴾ (سورة الزمر ١٠)

واتـــە: بێگومـــان پاداشـــتی خـــۆراگران بـــەبێ ئەنـــدازە دەدرێتە وە..

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ تاوانەکانت بسررێتە وە..؟*

وەڵام/ پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دەفەرمێ: مَنْ قَالَ سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَـرَّةٍ حُطَّـتْ خَطَايَـاهُ وَإِنْ كَانَـتْ مِثْـلَ زَبَدِ الْبَحْرِ.(متفق عليه)

واتــە: هەرکەسـێك لەرۆژێکـدا سـەدجار بڵـێ ﴿سـبحان الله وبحمده﴾ گوناهەکانی دەسڕێتە وە، هەرچەندە بەئەندازەی کەفی سەردەریابێت.

*پرسیار/ ئایە دەتەوێت لەرۆژی دواییدا ڕزگارت بێت .؟*

پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دەفـەرمووێ: مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرا أَوْ وَضَـعَ عَنْــهُ أظَلَّـهُ اللهُ في ظِلِّـهِ يَـوم لاظِــلَّ إلاّظِلُّـه (رواه أحمدوالترمذي وصححه الألباني)

واتە: هەرکەسێك مۆڵەتی قـەرزارێك بـدات یـاخود لەسـەری لای ببـات، خـوای گـەورە لەژێرسـێبەری عەرشـی خۆیـدا سێبەری بۆ دەکـات، لەرۆژێکدا جگـە لـە سـێبەری ئـەو هـیچ سێبەری ترنیە.

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ پارێزراوبیت لەگەرمای ئاگر..؟*

وەڵام/ پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دەفـەرمووێ: مَنْ كـانَ لَـهُ ثَـلاثُ بَنـاتٍ فَصَـبرَعَليهِنَّ وَأطعَمَهُـنَّ وَسَـقاهُنَّ وَكَسـاهُنَّ مِـن جِيدَتِـهِ كُـنَّ لَـهُ حِجابـاً مِـنَ النّـارِ يَـوْمَ القِيامَـةِ. (رواه أحمـد

**وصححه الألباني) واتە: هەرکەسێك سێ کچی هەبێت و ئارامیان لەسەربگرێت و خواردن وخواردنەوەیان بداتێ و پۆشتەیان کات لەدەوڵەمەندی خۆی، ئەوا بۆی دەبن بە بەربەست لەئاگر لەرۆژی دواییدا.**

*پرسیار/ ئایە شەفاعەت و تکای پێغەمبەرت﴿صلى الله عليەوسلم﴾ دەوێ.؟*

**وەڵام/ پێغەمبەر﴿صلى اللەعليه وسلم﴾ دەفەرمووێ: مَنْ صَلى عَليَّ حِينَ يُصْبحُ عشْراً وَحِينَ يُمْسِي عشْراً أدرَكَتْهُ شَفاعَتي يَوْمَ القِيامَةِ.(رواه الطبراني وصححه الألباني)**

**واتە: هەرکەسێك کە ئێوارەی کردەوە دەسەڵاواتم لەسەربدات وە بەیانیشی کردەوە دەسەڵاواتم لەسەربدات، ئەوا لەرۆژی دوایدا شەفاعەت و تکای منی پێدەگات.**

*پرسیار/ ئایە ئازادبوونت دەوێ لەئاگر..؟*

**وەڵام/ پێغەمبەر﴿صلى الله عليەوسلم﴾ دەفەرمووێ: مَنْ ذَبَّ عَنْ عِرْضِ أخِيهِ بالغَيْبَةِ كانَ حَقا عَلى اللهِ أنْ يَعْتِقَهُ مِنَ النارِ. (رواه أحمد وصححه الألباني)**

واتە: هەرکەسێك لە پەنهانیدا بەرگری لە ناموسی براکەی بکات، پێویستە لەسەرخوای گەورە لەئاگرئازادی بکات.

*پرسیار/ ئایەماڵێکت دەوێ لەبەهەشتدا..؟*

وەڵام/ پێغەمبەر﴿صلی الله علیه وسلم﴾ دەفەرمووێ: مَنْ بَنَى مَسْجداً لِلهِ يذْكُرُ اللهَ فيهِ بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاًفِي الجَنَّةِ. (رواه أحمدوالنسائي)

واتە: هەرکەسێك لەبەرخوا مزگەوتێك دروست بکات و یادی خوای تێدابکات، خوای گەورەش بەوێنەی ئەوماڵە لەبەهەشتدا ماڵێکی بۆدروست دەکات، وە دەفەرمووێ:

مَنْ ثابَرَعَلى ثِنتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ السُّنَّةِ بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الجَنَّةِ. (رواه الترمذي وصححه الألباني)

واتە: هەرکەسێك بەردەوام بێت لەسەرئەنجامدانی دوانزەرکات نوێژی سوننەت خوای گەرە لەبەهەشتدا ماڵێکی بۆدروست دەکات، وە دەفەرمووێ: مَنْ قَرَأَ قُلْ هُوَ اللهُ أحَدْ عَشْرَمَرَّةً بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الجَنَّةِ.(رواه أحمد)

واته: هەرکەسێك دەجار﴿قل هوالله أحد﴾ بخوێنێت خوای گەورە لە بەهەشتداماڵێکی بۆدروست دەکات

*پرسیار/ ئایە جلی ئاوریشمت دەوێ.؟*

وەڵام/ پێغەمبەر﴿ صلی الله علیه وسلم﴾ دەفەرمووێ: مَنْ كَفَّنَ مَيتاً كَساهُ اللهُ مِنَ السُندُسِ.

(رواه الحاكم في المستدرك وقال صحيح على شرط مسلم)

واتە: هەرکەسێك موسڵمانێك کفن بکات خوای گەورە بەپۆشاکی ئاوریشم دەیپۆشێ.

*پرسیار/ ئایە داروەرە ختت دەوێ لەبەهەشتدا..؟*

وەڵام/پێغەمبەر﴿صلی الله علیه وسلم﴾دەفەرمووێ: مَنْ قَالَ سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ غُرِسَتْ لَهُ بِهائَخلَةٌ فِي الجَنَّةِ.

(رواه الترمذي وصححه الالباني)

واتە: هەرکەسێك بڵێ﴿سبحا ن الله وبحمده﴾بەهۆیەوە دارخورمایەکی بۆدەنێژرێ لەبەهەشتدا

*پرسیار/ ئایە ئافرەتت دەوێ لەبەهەشت.؟*

وەلام/ پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾دەفەرمووێ: مَن كَتمَ غَيظاً وَهوَ قادرٌ علَى أن يُنفِذَهُ دَعاهُ اللهُ عَلى رُؤسِ الخَلائِقِ حَتَى يُخيِّرهُ مِنَ الحُورِ العِينِ يُزَوِّجهُ مِنها مايَشاءُ (رواه أحمدوابن ماجه)

واتە: هەرکەسێك رق و کینەیەك بخواتەوە و تواناشی هەبێت جێ بەجێی بکات، خوای گەورە لەناوهەمووخەڵکیدا بانگی دەکات بۆ ئەوەی سەرپشکی بکات لە هەڵبژاردنی حۆری، وەکامەیانی بوێت دەیکات بە خێزانی

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ پلەوپایەت بەرزبێت لای خوای گەورە.؟*

وەلام/ پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دەفەرمووێ: مَنْ تواضَعَ للهِ رَفعَهُ اللهُ (رواه أحمد وصححه الألباني)

واتە: هەرکەسێك لەبەرخاتری خوا خۆی بەنزم بزانیت خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە

*پرسیار/ئایە دەتەوێ لە شەیتان پارێزراوبیت.؟*

*وەڵام/* **پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: من قال لا إله إلا الله وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيئٍ قَديرٌ،في يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، كانَتْ لَهُ عَدْلُ عَشْرِ رِقَباتٍ وكانَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ ،وَكانَتْ لَهُ حِرْزاً مِنَ الشَيْطانِ يَوْمَهُ ذلِكَ حَتى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِما جاءَ بِهِ إلا أَحَدٌعَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذلِكَ.(رواه الإمام مالك في الموطأ)**

**واتە: هەرکەسێك لە ڕۆژێکدا سەدجار بڵێ:(لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيئ قدير)**

**وەکو ئەوە وایە دەبەندەی ئازاد کردبێت و، سەد چاکەشی بۆدەنوسرێت و سەدتاوانیشی لێ دەسڕرێتەوەو، ئەوڕۆژەش لە شەیتان دەیپارێزێ تاکو ئێوارە دەکاتەوە، وەهیچ کەسێك لەوی چاکتر نەکردوە، مەگەر کەسێك زیاتری لەو کردبێت .**

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ لە فیتنەی دەجال پارێزراوبیت.؟*

**وەلام/ پێغەمبەری خوا(صلی الله علیەوسلم) دەفەرمووێ: مَن حَفِظَ عَشرَ آیاتٍ مِن أوّلِ سُورةِ الکَهفِ عُصِمَ مِن فِتنةِ الدَّجالِ(رواه مسلم)**

**واتە: هەرکەسێك دەئایەت لەسەرەتای سورەتی کەهف لەبەر بکات لەفیتنەی دەجال پارێزراودەبێت**

*پرسیار/ ئایە رۆزی وتەمەن درێژیت دەوێ.؟*

**وەلاّم/ پێغەمبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) دەفەرمووێ: مَنْ أحَبَّ أن یُبسَطَ لَهُ فِي رِزقِهِ وَأنْ یُنسَأَلهُ فِي أثَرِه فَلْیَصِلْ رَحِمَهُ(متفق علیه)**

**واتە: هەرکەسێك پێی خۆشە رۆزی زۆربێت و تەمەنی درێژبکرێت(لەلایەن خواوە)باسەردانی خزمەکانی بکات.**

*پرسیار / ئایە پاسەوانی و پارێزگاریت دەوێ لەلایەن خوای گەورەوە.؟*

**وەلأم/ پێغەمبەری خوا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾دەفەرمووێ: مَنْ صَلَّى الْفَجْرَ فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللهِ (رواه الطبراني وصححه الألباني)**

**واتە: هەرکەسێك نوێژی بەیانی ئەنجام بدات ئەوە لەزەمانەت و پاراستنی خوای گە ورەدایە و،لێپرسینەوەشی لەسەرخوای گەورەیە.**

*پرسیار/ئایە دەتەوێ کەسێك بۆت بپارێتە وە هیچ تاوانی نەکردبێ و بێگوێی پەروەردگاری نەکردبێ.؟*

**وەلأم/پێغەمبەری خوا﴿صلى الله عليه وسلم﴾دەفەرمووێ: مَنْ دَعى لأخِيهِ بظهرِالغَيبِ قالَ لَهُ الملكُ المُوكّلُ بهِ أمِين ولكَ بمِثلِهِ.(رواه مسلم)**

**واتە: هەرکەسێك بە پەنهانی و نهێنی بۆبراموسڵمانەکەی بپارێتەوە فریشتە نێردراوەکە دەڵێ ئامین و بەوێنەی ئەو پارانەوەش بۆ تۆ .**

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ بەری و دوربیت لە دوڕووی و ئاگر.؟*

وەڵام/ پێغەمبەری خوا﴿صلی الله علیه وسلم﴾ دەفەرمووێ: مَن صلى لله أربَعِين يَوماً في جَماعَةٍ يُدرِكُ التَّكبِيرَة الأُولى كُتِبَ لَهُ بَراءَتَانِ بَرَاءَةٌ مِنَ النَّارِ وَبَرَاءَةٌ مِنَ النِّفاقِ (روه الترمذي وصححه الألباني)

واتە: هەرکەسێك چل ڕۆژ نوێژ بکات بەکۆمەڵ و بگاتە ﴿الله أكبر﴾ ی یەکەم، دوبەری بونی بۆدەنوسرێت ، بەری بونێك لە ئاگرو بەری بونێك لە دوڕوویی.

*پرسیار/ ئایە پاداشتی ئازادکردنی بەندەیەکت دەوێ.؟*

وەڵام/ پێغەمبەری خوا﴿صلی الله علیه وسلم﴾دەفەرمووێ: مَن طافَ بِالبَيتِ سَبعاً، وَصَلى رَكعَتَينِ، كانَ كَعِتقِ رَقَبَةٍ (روه ابن ماجه)

واتە: هەرکەسێك حەوت جار بەچواردەوری بەیت ﴿کەعبە﴾دا بسوڕێتەوە و دورکات نوێژیش بکات، وەکو ئەوە وایە بەندەیەکی ئازاد کردبێت، وەدەفەرمووێ: مَن قال لا إله إلاالله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد وهو على

كُـلِّ شَـيئٍ قَديرعَشَـراً، كـانَ كَمَـن أعتـقَ رَقَبَـةً مِـن وَلَـدِ إسماعِيلَ.(متفق عليه)

واتە: هەركەسێك بڵێ:﴿لاإله إلاَّالله وحده لاشريك له، له الملك ولـه الحمـد وهـوعلى كـل شـيئ قـدير﴾ پاداشـتی وەكوئـەو كەسەوايە كە بەندميەكی لەنـەوەی إسماعيـل (عليـه السلام) ئازادكردبێت.

*پرسـيار/ئايـە دەتـەوێ خـوای گـەورە دەسـەڵاوات لەسـەر بدات.؟*

وەڵام/ پێغەمبـەری خـوا﴿صلى الله عليـه وسلم﴾ دەفـەرمووێ: مَـن صَـلى عَلَـيَّ واحِـدَةً صَـلَّىَ اللهُ عَلَيـهِ عَشرِصَـلواتٍ،وحَطَّ عَنـهُ عَشرَخَطِيئاتٍ، وَرَفِعَ لَهُ عَشرِدَرَجاتٍ. (رواه البخاري)

واتە:هەركەسێك يەك سەڵاواتم لەسەر بدات خوای گـەورو دە سەڵاواتی لـە سـەردەدات و، دە تاوانيشـی لەسەردەسڕێتەوەو، دەپلەش بەرزی دەكاتەوە.

*پرسیار/ ئایە پلەی شەهادەتت دەوێ لە پێناوی خوادا.؟*

وەلام/ پێغەمبەر ﴿صلی الله علیه وسلم﴾دەفەرمووێ: مَنْ طلبَ الشَّهادَةَ صادِقاً أعْطها وَلوْ لمْ تصِبْهُ.(رواه مسلم وأحمد)

واتە: هەرکەسێك بەڕاستگۆیی داوای شەهادەت بکات پێی دەبەخشرێت هەرچەندە توشیشی نەبێت.

*پرسیار/ ئایە دە تەوێ لەخوای گەورە نزیك بیت.؟*

وەلام/پێغەمبەری خوا﴿صلی الله علیه وسلم﴾دەفەرمووێ: أقْرَبُ مايَكُونُ العَبْدُمِنْ رَبِّهِ وَهُوَ ساجِدٌ فأكْثِروا الدُّعاءَ (رواه مسلم وأحمد)

واتە: نزیکترین کاتێك کەبەندە لەخوای خۆیەوە نزیکە ئەو کاتەیە کە کوڕنووش(سجدە)دەبات بۆیە زۆر بپاڕێنەوە تێیدا.

*پرسیار/ ئایەدەتەوێ پاداشتی شەونوێژی شەوێکی تەواوت دەست بکەوێ.؟*

وەلام/ پێغەمبەری خوا﴿صلی الله علیەوسلم﴾دەفەرمووێ: مَنْ صَلىَّ العِشاءَ في جَماعَةٍ فكَأنَّما قامَ نِصفَ اللَيلِ وَمَنْ صلى الصُّبحَ في

**جَماعَةٍ فَكَأنَّما صَلىَّ اللَيلَ كُلَهُ(رواه مسلم)**

**واتە: هەرکەسێك نوێژی عیشا بەکۆمەڵ بکات وەکو ئەوە وایە تاکو نیوە شەو شەو نوێژی کردبێت، وەهەرکەسێك نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ بکات وەکو ئەوە وایە هەموو شەوەکە شەو نوێژی کردبێت.**

*پرسیار/ئایە دەتەوێ خوای گەورە نێوان تۆ و ئاگری دۆزەخ حەفتا ساڵ دوربخاتەوە.؟*

**وەلاّم/ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دەفەرمووێ: ما مِنْ عَبْدٍ يَصومُ يَوماً فِي سَبيلِ اللهِ إلاَ باعِدِ اللهُ بِذلِكَ اليَومِ وَجهَهُ عَنِ النار سَبعينَ خَرِيفاً.(متفقٌ عليه)**

**واتە: هیچ بەندەیەك نیە لەبەرخاتری خوای گەورە یەك ڕۆژ بەڕۆژوبێت ئیللا خوای گەورە بەهۆی ئەو ڕۆژەوە حەفتاپایز(ساڵ) دەموچاوی لەئاگری دۆزەخ دور دەخاتەوە.**

*پرسیار/ ئایە ڕێگەیەکت دەوێ بتبات بەرەو بەهەشت .؟*

**وەلاّم/ پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دەفەرمووێ: وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلماً سَهَّلَ اللهُ لَهُ طَرِيقاً إلىَ**

الجَنَّةِ(متفق عليه)

واتە: هەرکەسێك ڕێگەیەك بگرێت کە زانست و زانیاری تێدا دەست بکەوێت، خوای گەورە بەهۆیەوە ڕێگای چوون بۆ بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات .

*پرسیار / ئایە پاداشتی حەجێکت دەوێت.؟*

وەلاّم/ پێغەمبەری خوا﴿صلى الله عليه وسلم﴾دەفەرمووێ: عُمْرَةٌ فِي رَمَضانَ تعْدِلُ حجَّةً مَعي.(متفقٌ عليه)

واتە: عومرە کردنێك لە ڕەمەزاندا وەکو حەجکردنێکە لەگەڵ مندا .

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ ڕەزامەندی خوات دەست بکەوێ.؟*

وەلاّم/ پێغەمبەری خوا﴿صلى الله عليه وسلم﴾دەفەرمووێ: إنَّ اللهَ لَيَرْضى عَنِ العَبْدِ أن يأكُلَ الأكْلَةَ فيَحْمَدَهُ عليها، أوَيَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فيَحْمَدَهُ عليها. (رواه مسلم)

واتە: بەڕاستی خوای گەورە لەبەندەی خۆی ڕازی دەبێت کاتێك کە خواردنێك دەخوات سوپاسی خوای لەسەر دەکات، یاخوود کاتێك خواردنەوەیەك دەخواتەوەو سوپاسی خوای

لەسەر دەکات.

*پرسیار.؟ ئایە دەتەوێ لەبەهەشتا هاوەڵی پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾بیت.؟*

وەڵام/ پێغەمبەری خوا﴿صلى الله عليه وسلم﴾دەفەرمووێ: أنَا وَكافِلُ اليَتيمِ في الجَنّةِ هكَذا.(رواه البخاري وأحمد)

واتە: من و ئەوکەسەی منداڵی بێباوك بەخێودەكات وە ئەم دوپەنجە واین، ئاماژەی بەهەردو پەنجەی ناوەڕاست و شایە دومانی کرد.

*پرسیار/ ئایە گەنجینەیەکت دەوێ لە گەنجینەکانی بەهەشت.؟*

وەڵام/ پێغەمبەری خوا﴿صلى الله عليه وسلم﴾دەفەرمووێ: ياحازم أكثِرمِنْ قَولِ لاحَولَ ولاقوّةَ إلا باللهِ فإنّها كنزٌمِنْ كنوزِالجَنّةِ.(رواه ابن ماجه وصححه الألباني)

واتە:ئەی حازم زۆرووتەی (لاحول ولاقوه إلا بالله)بلێ ، چونکە گەنجینەیەکە لەگەنجینەکانی بەهەشت.

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ خوای گەورە حەزی لە دیدارت بێت.؟*

**وەلاَم/پێغەمبەری خوا﴿صلى الله عليه وسلم ﴾دەفەرمووێ: مَن أحَبَّ لِقاءَ اللهِ أحَبَّ اللهُ لِقاءَهُ. (رواه أحمد وصححه الألباني)**

**واتە: هەرکەسێك حەزی لە دیداری خوای گەورە بێت خوای گەورەش حەزی لە دیدارێتی.**

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ حەفتا هەزار فریشتە سەلاَواتت لەسەربدەن.؟*

**وەلاَم/ پێغەمبەری خوا﴿صلى الله عليه وسلم﴾دەفەرمووێ: مامِنْ مُسلِمٍ يعودُ مُسلماً غُدوةً إلاصلى عَليهِ سَبعُونَ ألفَ مَلك حتى يُمسي، وإنْ عادَهُ عشيَّةً إلاصلى عَليهِ سبعونَ ألفَ مَلكٍ حَتى يُصبحَ، وَكانَ لهُ خَريفٌ فِي الجنةِ.(رواه الترمذي)**

**واتـــە: هەرموســـڵمانێك لـــەکاتی بەیانیـــدا ســـەردانی مووسڵمانێکی نەخۆش بکات حەفتا هەزار فریشتە سەلاَواتی لەســـەردەدەن(داوای لێخۆشـــبونی بۆدەکـــەن) هەتائێوارەدەکاتـــەوە، وەئەگەرلەئێوارەدا سەردانی بکاتەوە حەفتا هەزار فریشتە ســـەلاَواتی لەســـەردەدەن تـــاکو بـــەیانی دەکاتـــەوە،**

وەلەبەهەشتیشدا بەرووبوم و میوەهاتی بۆهەیە.

*پرسیار/ئایە دەتەوێ سەدچاکەت دەست بکەوێ.؟*

وەلام/ پێغەمبەری خوا﴿صلى الله عليه وسلم﴾دەفەرمووێ: مَنْ قتَلَ وَزَغةً في أوّلِ ضَرْبةٍ كُتبَ لهُ مائةُ حَسَنةٍ. (رواه مسلم)

واتــە: هەرکەســێك بەیەکــەم لێــدان شــەوگەردێك بکوژێــت سەدچاکەی بۆ دەنوسرێت.

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ پاداشتی ڕۆژوانێکت بۆ بنوسرێت.؟*

وەلام/ پێغەمبــەری خــوا﴿صلى الله عليــه وسلم﴾دەفــەرمووێ: مَــنْ فطرَصائِماً كانَ لـهُ مثل أجرهِ، غيْرَ أنّهُ لايَنقصُ مِنْ أجْرِ الصائم. (رواه أحمدوالنسائي وصححه الألباني)

واتە: هەرکەسێك ڕۆژووی ڕۆژووانێـك بشکێنی(خواردنێکی بداتێ لەکاتی ڕۆژووشکاندندا) بەوێنــەی ڕۆژووانەکــە پاداشــتی بۆهەیــە، بەبێ ئەوەی لەپاداشتی ڕۆژوانەکە کەم ببێتەوە.

*پرسیار/ئایە دەتەوێ ڕۆژی دوایت لەبیربێت.؟*

وەلام/پێغەمبەری خـوا﴿صلى الله عليـه وسلم﴾ دەفـەرمووێ:عُودوا المَرضى واتبعوا الجَنائزَ تذكّرْكمُ الأخرةَ(رواه البخاري).

واتە: سەردانی نەخۆش بکەن و بەدوای مردوودا بڕۆن بیری ڕۆژی دواییتان دەخاتەوە.

*پرسیار/ئایە دەتەوێ لەڕۆژی دواییدا خوای گەورە بەزەیی پێتدابێتەوە.؟*

وەڵام/پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دەفەرمووێ:مَنَ رَحِمَ وَلَوْ ذَبِيحَةِ عُصنفُورِ، رَحِمَهُ اللهُ يَوْمَ اَلقِيامَةِ. (رواه البخاري)

واتە: هەرکەسێك بەبەزەیی و دڵ نەرم بێت هەرچەندە لەکاتی سەربڕینی چۆلەکەیەکدا بێت،خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا بەزەیی پێدادێتەوە.

*پرسیار/ئایە دەتەوێ باشترین تاوانباربیت.؟*

وەڵام/پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾دەفەرمووێ:كُلُ بَنِي أدَمَ خَطاءَ، وَخَيْرُالخَطائِينَ التَوابُونَ. (رواه أحمدوالترمذي)

واتە: هەموو نەوەکانی ئادەم زۆرتاوان دەکەن، باشترینی تاوانبارانیش ئەوانەن زۆرتەوبە دەکەن و پەشیمان دەبنەوە.

*پرسیار/ئایە دەتەوێ دڵت نەمرێ.؟*

**پێغەمبەری خوا﴿صلی الله علیەوسلم﴾ دەفەرمووێ:لاتکثروا الضحِكَ فإنَّ كثرةَ الضحِكِ تميتُ القلبَ(رواه أحمدوابن ماجه)**

**واتە:زۆرپێمەکەنن چونکە زۆرپێکەنین دڵ دەمرێنێ.**

*پرسیار/ئایە دەتەوێ لەهاوەڵپەرستی(شرك)دووربیت.؟*

**وەڵام: پێغەمبەری خوا﴿صلی الله علیە وسلم﴾دەفەرمووێ:إقرأ قُل يأيُّها الكافِرونَ عندَ نَومِكَ فإنَّها براءةٌ مِنَ الشِّرْكِ. (رواه أبوداودوالترمذي)**

**واتە: لەکاتی خەوتنتدا سورەتی(قل يأيهاالكافرون)بخوێنە، چوونکە خوێندنەوەی بەریی بوونە لە هاوەڵپەرستی.**

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ لای پێغەمبەر﴿صلی الله علیە وسلم﴾ خۆشەویسترین کەس بیت.؟*

**وەڵام/پێغەمبەری خوا﴿صلی الله علیە وسلم﴾دەفەرمووێ:إنَّ مَنْ أحَبُّكُمْ إليَّ أحسَنُكُمْ خُلقاً.(رواه البخاري)**

**واتە:خۆشەویسترین کەستان لای من ئەو کەسەیە کەڕەوشتی زۆرجوانە.**

*پرسیار/ئایە دەتەوێ باشترین کردەوە بکەیت.؟*

وەلأم/پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دەفەرمووێ:أفضَلُ الأعمالِ الصَلاةُ لِوَقتِها وَبِرُ الوالِدَينِ وَالجهادُ في سَبيلِ اللهِ.(متفقٌ عليه)

واتە: باشترین کردەوە نوێژکردنە لەکاتی خۆیداو چاکەکردنە لەگەڵ دایك و باوكدا و تێکۆشانە لەپێناوی خوای گەورەدا.

*پرسیار/ئایە دەتەوێ نیوەی باوەڕت تەواو بێت.؟*

وەلأم/پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دەفەرمووێ : مَن تَزَوَّج فَقَد إستَكمَلَ نِصفَ الإيمانِ، فَليَتَقِ اللهَ في النِصفِ الباقي.(رواه الطبراني وصححه الألباني)

واتە: هەرکەسێك ژنی هێنا نیوەی باوەڕی تەواوکردوە، با لەنیوەکەی تردا لەخوا بترسێ وخۆی بپارێزێ.

*پرسیار/ئایە دەتەوێ خوای گەورە ڕزق و ڕۆزیت بداتێ.؟*

وەلأم:پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دەفەرمووێ:لَو اَنَكُم تَوَكَلُونَ عَلى اللهِ حَقَّ تَوَكُلِهِ، لَرَزَقَكُم كَما يَرزَقُ الطَيرَ، تَغدو خِماصا

وَتروح بطانا،(رواه أحمدوالترمذي وصححه الألباني)

واتە: ئەگەرئێوە بەتەواوەتی پشت بەخوای گەورە ببەستن، ئەوا خوای گەورە رزق و ڕۆزیتان دەدات، وەکوچۆن ڕۆزی باڵندە دەدات کەبەیانی بەسك بەتاڵی دەردەچێ و ئێوارەش بەتێری دەگەڕێتەوە..

*پرسیار/ئایە دەتەوێ کەسێکی خاوەن پلەوپایە بیت.؟*

وەڵام/پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دەفەرمووێ:فضلُ ألعالم علَى العابد، كَفَضْلِ القَمَرِليلةِ البَدرِعلى سائرالكَواكبِ.(رواه أبونعيم وصححه الألباني)

واتە: فەزڵ و گەورەیی زانا بەسەرخواپەرستدا، وەکو فەزڵ و گەورەیی مانگی چواردە وایە بەسەرئەستێرەکانی تردا.

*پرسیار/ئایە دەتەوێ فریشتەکانی خوای گەورە چواردەورەت بدەن.؟*

وەڵام/پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دەفەرمووێ:لايَقْعُدُ قَوْمٌ يَذكُرونَ اللهَ تعالى إلاحَفَتهُمُ المَلائكَةُ، وَغَشيَتهُمُ الرَحمَةُ، وَنَزَلَت عَليهِمُ السَكينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فيمَن عِندَهُ.(رواه مسلم)

واتە:هەرکۆمـەڵ و تاقمێـك دابنیشـن و یـادی خـوای گـەورە بکەن، ئیللافریشتەکانی خـوای گـەورە چواردەورەیان دەدەن و، بەزەیی دایان دەپۆشێ و، ئارامی بەسـەریاندا دادەبـەزێ و، خوای گەورەش لەلای فریشتەکانی خۆی باسیان دەکات.

*پرسیار/ ئایە دەتـەوێ چاکەی مـانگێکی مانـەوەی مزگـەوتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ت بۆبنوسرێت.؟*

وەلاَم/ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دە فە رمووێ: ولأن أمشي مَعَ أخٍ لي في حاجَةٍ أحَبُّ إليَّ مِنَ أن اعتكِفَ في هـذا المسجد(يعني مسجد المدينة) شَهراً.(رواه الطبراني في الأوسط)

واتـــە: ئەگـــەر لـــە گـــەڵ برايەکمـــدا بـــڕۆم بۆئەنجامـــدانی پێویستیەك پێم خۆشـترە لەمانـەوەی(إعتكاف) مانگێـك لـەم مزگەوتەدا.(واتە مزگەوتی مەدینە)

*پرســـیار/ ئایـــە دەتـــەوێ تاوانـــەکانت وەکـــو گـــەڵای دارهەڵوەرێت.؟*

وەلاَم/ پێغە مبەر(صلى الله عليه وسلم)دەفـەرمووێ:إنَّ المـؤمِن إذا لقِيَ المؤمن، فسَلمَ عَليهِ ،وَاخذَ بِيَدِهِ، فصافحَهُ تنـاثرَت خطايـا

هما كما يتناثرُ ورَقَ الشَجرِ (رواه الطبراني)

واتە: باوەڕدار کاتێك بگات بە باوەڕدارێك و سەلا می لێبكات و، دەستی بگرێت وتەوقەی لە گە ڵدابكات، ئەوا تاوانە كانیان هە ڵدەوەرێت وەكو چۆ ن گە ڵای دار هە ڵدەوەرێت.

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ خۆشترین موژدە بدەی بە خێزانەكەت.؟*

وەڵام/ پێغەمبەری خوا﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دە فەرمووێ:

إذاصلَّتِ المرأةُ خمسَها، وصامَتْ شهرَها، وحفِظتْ فرْجَها، وأطاعَتْ زوْجَها،قِيلَ لها:أدخلي الجنّةَ منْ أيِّ أبوابِ الجنّةِ شئتِ(رواه أحمد وصححه الأ لباني)

واتە: ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژەكەی كردو، مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژو بوو، وە داوێنی خۆی پاراست و، بەگوێی مێردە كەشی كرد، لەڕۆژی دواییدا پێی دەوترێ: لە كام دەرگای بەهەشتەوە دەتەوێ بچۆ ژوورەوە.

*پرسیار/ ئایە دەتەوێ دەستێکی باشت هەبێت.؟*

**وەلام/ پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دە فەرمووێ:أليَدُ العُلياخَيرٌمِنَ اليَدِ السُفلى، واليَدُ العُليا مُنفِقةٌ، واليَدُ السُفلى السَائِلةٌ.(متفق عليه)**

**واتە:دەستی بڵند باشترە لە دەستی نزم و نەوی، دەستی بڵند دەبەخشێ، دەستی نەوی و نزمیش داوا و سواڵ دەکات.**

